# چۆنیەتی

# حەج و عومرە

## وەك

## لە پێغەمبەرﷺ وەرگیراوە

لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاشَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ،
إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاشَرِيكَ لَكَ


کۆکردنەوەی
عبداللە عبدالعزیز هەرتەلی

# چۆنیەتی حەج و عومرە
## وەك
# لە پێغەمبەرﷺ وەرگیراوە

کۆکردنەوەی
عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

چاپی یەکەم

جمادی‌الأولی: ١٤٢٨ی کۆچی
جۆزەردان: ٢٧٠٧ی کوردی
حزیران: ٢٠٠٧ی زایینی

ئەم پەڕتوکە وەکو مامۆستایەکی ئایینی ڕێنموونیت دەکا لە سەفەری حەج: دوعاو سوننەتەکانی سەفەر، تەیەممومم، (قَصْر)و(جَمْع)ی نوێژ، قوربانی، حەج وعومرە، گشتی تێدا ڕوون کراونەوە.

ئەی موسوڵمانی خۆشەویستو ڕێزدار، تکایە:

١-پێش سەفەری حەج، ئەم کتێبە بە وردی بخوێنەوە.

٢-بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستی خۆت، بەڵکو لە لای مامۆستایئایینی بیخوێنە، چونکە-چەند پێناسەو زاراوەیەکی شەرعی هەنە- لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.

ناوی کیتاب: چۆنیەتی حەج و عومرە.

دانەر: عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە.

## *دانراوەکانیتری دانەر:

١-هـــۆنـراوەی﴿ ئیمانو ئیسلام ﴾

٢-ڕوونکردنەوەی﴿ الأربعین النواویة ﴾

٣-﴿عەقیدەی ئیسلامی﴾

٤-ڕوونکردنەوەی﴿ العقیدةالطحاویة ﴾

٥-چەند گوڵێك لە ﴿ گوڵزاری ئیسلام ﴾

٦-﴿ڕۆژی پرشنگدار، ڕوونکردنەوەی(متن فتح القریب)﴾

٧-ڕوونکردنەوەی﴿قطر العارض فی علم الفرائض﴾

٨-﴿ڕووناکی(رب العالمین) ڕوونکردنەوەی(منهاج الطالبین)﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

اَلْـحَمْدُ للهِ رَبِّ الْـعَالَمِينَ وَالـصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّـدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ.

ئـەی موسـولّمانی خۆشەویسـتو ڕێـزدار، هـەروەك ئاشـكرایە: حـەجی مـاڵی خـوا لـە(مَكّـة)، پێنجـەمین ڕوكنیئیسـلامەو ئەنجامدانیشی ماندووبوونێكی زۆرو سـەرفكردنی ماڵیشـی دەوێ، هەم بۆ دروستبوونیشـی شـارەزاییەكی زۆری شـەرعی-لـە باسـی حـەجو عـومرەی- دەوێ؟ چـونكە پێغەمبـەرﷺ لـە حـەجی ماڵئـاواییدا فـەرمووی: ﴿لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِـكَكُمْ﴾رواه مسلم وغـيره، كردەوەكـانی حـەجو عـومرە لـە مـن وەربگـرن. كـەوابو: مەرجـە-ئـەم ڕوكنــە گرنگـەی ئیسـلام-بـەگوێرەی فــەرمانی پێغەمبەرﷺ ئەنجام بدرێ.

جا-بە داخەوە- هەستم كرد لـەم سـالانەدا بـە زۆری هەڵـەی گـەورەو ناشـەرعی لـە حـەج كردنـدا ڕوویدەدلو كێشـەو نـاكۆكیش دەكـەوتـە نێـوان حاجیـەكان، (فتـوا)ی بـە هەڵـەش هۆیـەكی سـەرەكی ئـەو ڕوودلوانە بوو، جا بۆ ئەوەی ئەم ڕوكنە گرنگەی ئیسلام بـە دروستیو بەگوێرەی فەرمانیپێغەمبەرﷺ ئەنجام بدرێو كێشەو نـاكۆكیش كـەم ببێتەوە، ناوی خوام لێهێناو هەڵسام: لە كتێبی (الإیضـاح فـی مناسك الحج والعمرة)ی ئیمامی(النَّـوَوي)و چـەند كتێبێكـی تـری بـاوەڕپێكرلو، گوڵبــژێرێكم كـرد: لــەبارەی سـوننەتەكانی سـەفەر، هــەم باسـی (تەیـەمموم)و (نوێـژیڕێبوار)و (قوربـانی)و (حـەجو عـومرە)شـم لـە

کتێبــی ﴿ڕوونــاکی(رب العــالمين) ڕوونکردنــەوەی(منهــاج الطــالبين)﴾ هێنانو لەم پەڕتوکەدا کۆم کردنـەوەو چـەند مەسـەلەیەکی گرنگیشـم لێزیاد کردنو ناوم نا:

﴿چۆنیەتی حەج و عومرە، وەك لە پێغەمبەرﷺ وەرگیراوە﴾

جـا ئـەی موسـوڵمانی ڕێزدار، دڵنیابـە: سەرچـاوەکانی ئـەم پەڕتوکـە -هــەموویان- کتێبــی بــاوەڕپێکراوو جێگــەی متمانــەی زانایــانی ئـاینین، بۆیـێ ئەگـەر بـە وردی ئـەم پەڕتوکـە بخـوێنی-إن شـاءالله- شارەزای (حەجو عومرە) دەبیو پێویستیت بـە کتێبێکیتـر نابـێ، جـا ئەگەر لـە مەسـەلەیەکی ئـەم پەڕتوکـە گومانـت هـەبو، تەماشـای ئـەو سەرچاوەیە بکە کە بۆم دیاری کردوی، کەواتە: هەرکاتێك بڵێم:

رواه الشیخان، مەبەستم ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.

رواه اصحاب السنن، مەبەستم ئیمامی(أبوداود والنسائی والترمذي)ن.

هــەروەك لــە سەرچــاوەکاندا فەرموویانــە، یــان ڕوون کراوەتــەوە، مەبەستم ئەم چوارکتێبەنە:

١-(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).

٢-(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانرلوی (الإمام إبن حجرالهيتمي).

٣-(نهاية المحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).

٤-(مغنيالمحتــاج: شـرح المنهــاج) دانـراوی (الإمــام محمـد الخطيــب الشربيني).

جـا ئەگـەر یـەکێك لـەو چـوارانە لەگەڵـدا نـەبێ، ئـەو کاتـە دەڵـێم: هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا...

﴿ئامۆژگــاری﴾: ئـەی موسـوڵمانی خۆشەویسـت، بـە (إجْمـاع)ی زانایانیئیسلام: (فتوا)دان بە فـەرموودەکانی بێهێز دروسـت نیـە، هــەروەك لــە (کتــاب القَضــاء)ی (تحفــة)و(الشــروانی)دا ڕوون کراوەتــەوە، جـا کـە دەبینـی لـە مەسـەلەیەکدا دوو فـەرموودەی بـەهێزو بـێهێزی زانایـانم هێنـاون، وا تێمەگـە: (فتـوا)دان بـە فەرموودەکــەی بــێهێز دروســتەو-بــۆ کــارپێکردن- لــە پلــەی فەرموودەکەی بەهێزە، بـەڵکو تـەنها بـۆ ڕێنمـوونیکردن هێناومـە: تاکو-لە حاڵەتێکی زۆر پێویست- لێقەوماوێك تەنها بۆخـۆی کـاری پێبکـا، جگـە لـەوەش کـارکردن بـە فـەرموودەی بـەهێز، خێـری زۆرتــرە لــە فــەرموودەی بــێهێز؟ چـونکە مانـدووبوونی زۆرتــرە، پێغەمبــەرﷺ لـە حــەجی ماڵئـاواییدا بــە حــەزرەتی (عائشــة)ی فـەرموو: ﴿ وَلَكِنَّها عَلَــى قَــدْرِ نَصَــبِكِ ﴾رواه مسلم، خێـری خواپەرسـتنت لـە سـەر ئەنـدازەی ماندووبوونتــە. کـەوابو: ئــەی حـاجیی ڕێـزدار، زۆر حەیفـە لـەو سـەفەرە دوورو درێـژەدا خێـری گەورەتر لەدست خۆت بدەی.

ئیتر لـە خوایگـەورە دەپاڕێمـەوە: حـەج و خواپەرستنەکانیترمان لێقبـوڵ بکـاو لـە خۆمـانو لـە دایكوباوکمـان خـۆش ببـێو بـە شــەفاعەتی پێغەمبــەرﷺ ڕێزدارمــان بکــاو بــە حــەوزی کەوســەر تێرئاومان بکاو بە بەهەشت شادمان بکا، آمین.

*　　　　*　　　　*

## ﴿پێشەکی: چەند ڕەوشتێکی سەفەری حەج و سەفەرەکانی تر﴾

**یەکەم:** هەر کاتێك ویستی بە سەفەر بڕوا، سوننەتە: ڕاوێژ بە مرۆڤێکی لێزان و دیندار بکا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ ڕاوێژ بە موسوڵمانەکان بکە لە کاروباردا.

ئینجا واجبە: ڕاوێژپێکراوەکەش بە بەرژەوەندیترین ڕێگە ئامۆژگاری ڕاوێژکەرەکە بکاو هیچ هەواوهەوەسی خۆی بەرچاو نەکا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، ڕاوێژپێکراو بە ئەمین داندراوە، واتە: نابێ خیانەت بکا.

**دووەم:** سوننەتە –بۆ سەفەرکردنەکەی– دوو ڕەکعەت نوێژی (إسْتخارَة) بکا: لە دوای (فاتحَة) لە ڕەکعەتییەکەمدا (قُلْ يَاأَيُّهَاالْكَافِرُونَ) و لە دووەمدا (قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ) بخوێنێ، ئینجا کە سەلامی داوە، بڵێ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ).

ئینجا ئەم دوعایەی (إسْتخارَة)ش بکا: ﴿ أَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، أَللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذاالأَمْرَ(هذاالسَّفَرَ) خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي –عاجِلِهِ وَآجِلِهِ– فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، أَللَّهُمَّ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذاالأَمْرَ(هذاالسَّفَرَ) شَرٌّ

لی فی دینی وَدُنْیایَ وَمَعاشی وَعاقبة أمْری-عاجلــه وَآجلــه- فَاصْرِفْهُ عَنِّی وَاصْرِفْنِی عَنْهُ وَاقْدُرْ لِیَ الْخَیْرَ حَیْـــثُ کَـانَ ثُـــمَّ أَرْضِنِی بِهِ ﴾ رواه البخاري. ئینجا دڵـی بۆ کـام لا خـۆش بـوو، بـا ئەویان بکا.

**سێیەم**: ئینجا کە دڵی هاتە سـەر ڕۆیشـتن، واجبـە: گـەردەنی خـۆی ئـازاد بکـا: بـە هاوسـەرەکەی‌و بـە دایـك‌و بـاوکی‌و بـەو کەسـانەی ستەمی لێکردون، یان کێشەیەك لـە نێوانیانـدا ڕوی‌داوەو مافـەکانیان بداتەوە، هەم تۆبە لـە گشـت گوناهـەکانی بکـا، هـەروەها سـوننەتە: وەسیـەتیش بنوسـێ‌و شـاهیدیش بگـرێ: بـۆ دانـەوەی ئەمانەتـەکان‌و مـارەیی ژنەکـەی-ئەگـەر نەیـدابێ-و ئـەو قەرزانـەی هێشـتا کـاتی دانــەوەیان نــەهاتوە، بــەڵام ئەگــەر مارەییەکــەو قــەزەکان کــاتی دانــەوەیان هاتبــێ، ئــەو کاتــە ئەگــەر هــەبوویی بــێ، واجبــە-پــێش سەفەرکردن-بیانداتەوە، یان ئیزن لە ژنەکەی‌و خـاوە قـەرزەکانی‌تر وەربگـرێ بـۆ سـەفەرکردنەکەی؟ چـونکە حەڕامــە-ئــەو جـۆرە قەرزدارە-بێ‌ئیزنی خـاوەن قەرزەکـەی بـۆ سـەفەر بچـێ‌و (قَصْـر)و (جَمْع)ی نوێژەکانیشی بۆ دروست نیە، هەروەك لە سەرچـاوەکان لـە باسی(صَلاةالمُسافر)دا فەرمووزیانە.

**چوارەم**: سوننەتە-بۆ سەفەرەکەی-زۆر بژێو و پـارەی حـەڵاڵ لەگـەڵ خۆیا ببا، تاکو بەخۆی نەبێتە بارگرانی لە سـەر خـەڵك، هـەم بشـتوانێ خێرو پیاوەتی‌ی پێ‌بکـا، هـەروەها خـۆی بپـارێ: ململانـەو دەمـەقاڵێ لەگـەڵ هاوڕێکـانی نـەکا، بـەڵکو ملکــەچ بــێ‌و بــەگوێرەی‌توانا

خزمەتیان بکاو کارەکانیان بۆ پێك بێنێ، جا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا خَرَجَ ثلاثَةٌ فی سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أحَدَهُمْ﴾رواه أبودلود بإسناد حسن، هەرکاتێك سێ کەس وێکرا بۆ سەفەر دەرچون، با یەکێکیان بکەنە ئەمیری خۆیان.

**پێنجەم:** سوننەتە-بۆ سەفەرکردن- هاورێیەکی شارەزاو ئەمینو خاوەن رەوشتێکی باش پەیدا بکا ﴿ عَنْ عَمْرو بن الْفَغْواء الخُزاعيّ رضي الله عنه -في قصَّة سفَره إلَى مَكَّةَ-: أنَّ النَّبيَّﷺ قَالَ لَهُ: إلْتَمِسْ صَاحباً..فَقُلْتُ: قَدْ وَجَدْتُ صاحباً وَهُوَ عَمْرُو بنُ أمَيَّةَ الضَّمْرِيّ، فَقَالَ النَّبيُّﷺ: إذا هَبَطْتَ بلادَ قَوْمه فاحْذَرْهُ، فإنَّهُ قَدْ قالَ الْقَائلُ: *أخُوكَ الْبكْريُّ فَلا تَأْمَنْهُ* ﴾ رواه أبودلود بسندصالح، پێغەمبەرﷺ بە (عەمر)ی(خوزاعی)ی فەرموو: هاورێیەك بۆ سەفەرەکەت پەیدا بکە. (خوزاعی)ش گوتی: (عەمر)ی(ضَمْری)م بۆ هاورێیەتی دەست کەوت. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەرکاتێك چوویە ناو وڵاتی گەلەکەی(ضَمْری)، خۆتی لێبپارێزە، چونکە بێژەر گوتویەتی: (*برا تۆبەرەکەشت لێی ئەمین مەبە*). مەبەست ئەمەیە: لە هەموو جۆرە کەسێك ئەمین مەبەو هەموو جۆرە کەسێکیش کەلکی هاورێیەتی‌ی نیە.

**شەشەم:** سوننەتە: رۆژی پێنج شەممە بۆ سەفەرەکەی بڕوا، ئەگەر نەگونجا، رۆژی دوو شەممە بڕوا، جا پێش ئەوەی لە ماڵەکەی بڕواتە دەرەوە، سوننەتە دوو رەکعەت نوێژ بە نیەتی (سُنَّةالسَّفَر) لە ماڵەوە بکا: لە دوای (فاتحَة) لە رەکعەتی‌یەکەمدا (قُلْ يَاأيُّهَا

الْكَافِرُنَ)و له دووهمدا (قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ) بخوێنێ، ئینجا که سهلامی داوه، (آيَةالْكُرْسِيّ)و (لِإِيلاَفِ قُرَيْشٍ) بخوێنێ، ئینجا له کاتی چوونه دهرهوهدا بڵێ: ﴿(بِسْمِ اللهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ وَلاَ حَوْلَ وَلاَقُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)، (أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ)﴾ رواهما أصحاب السنن: الأول حسن، والثانی صحیح.

**حهفتهم:** سوننهته -که بۆ سهفهر دهڕوا- خواحافیزی بکا: له خزمو کهسو دۆستو دراوسێکانیو بڵێ: ﴿ أَسْتَوْدِعُكُمُ اللهَ الَّذِى لاَتَضِيعُ وَدَائِعُهُ ﴾ حدیث حسن رواه إبن السنی، بهو خوایهتان ئهسپێرم که سپاردراوهکانی لهدهست ناچێ.

ئینجا نیشتهجێیهکهش خواحافیزی له ڕێبوارهکه بکاو بڵێ: ﴿أَسْتَوْدِعُ اللهَ دِينَكَ وَأَمانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ﴾رواه أصحاب السنن بسند صحیح، ئایینهکهتو ماڵهکهتو کهسهکانتو دوا کردهوهکانت به خوا ئهسپێرم.

**ههشتهم:** سوننهته نیشتهجێیهکه داوا له ڕێبوارهکه بکا: دوعای بۆ بکا؟ چونکه پێغهمبهرﷺ فهرموویهتی: ﴿ثَلاثُ دَعَواتٍ مُسْتَجاباتٌ لاشَكَّ فِيهِنَّ: دَعْوَةُالْوالِدِ وَدَعْوَةُ الْمُسافِرِ وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ﴾ رواه أبوداود بسند حسن، بێگومان سێ دوعا قبوڵن: دوعای دایكوباوك، دوعای ڕێبوار، دوعای ستهملێكراو. جا به تایبهتیش ئهگهر ڕێبوارهکه بۆ حهجو عومره بڕوا ﴿عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: إِسْتَأْذَنْتُ النَّبِيَّﷺ

فِي الْعُمْرَةِ فَأَذِنَ لِي وَقَالَ: لاَتَنْسَنَا -يَاأُخَيَّ- مِنْ دُعَائِكَ﴾ رواه أبوداود بسند صحيح، ئیمامی (عُمَر رضي الله عنه) فەرمووی: ئیزنم وەرگرت بڕۆمە عومرە، جا پێغەمبەر ﷺ ئیزنی دام و فەرمووی: لەبیرمان مەکە -هۆ برایۆکەم- لە دوعایەکەت.

**نۆیەم:** هەرکاتێك ویستی سواری وڵاغ -واتە: یان کەشتی، یان فڕۆکە، یان ئۆتۆمبێل- ببێ، سوننەتە بڵێ: (بِسْمِ اللهِ). ئینجا کە بە تەواوی سوار بو، بڵێ: ﴿اَلْحَمْدُ للهِ، سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَاكُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ، اَلْحَمْدُ للهِ اَلْحَمْدُ للهِ اَلْحَمْدُ للهِ، اَللهُ أَكْبَرُ اَللهُ أَكْبَرُ اَللهُ أَكْبَرُ، سُبْحَانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي إِنَّهُ لاَيَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ﴾ رواه أصحاب السنن بإسناد صحيح.

هەروەها ئەم دوعایەش بکا: ﴿اَللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا اَلْبِرَّ وَالتَّقْوَى وَمِنَ الْعَمَلِ مَاتَرْضَى، اَللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ، اَللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ، اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الأَهْلِ وَالْمَالِ، اَللَّهُمَّ اطْوِ لَنَا الأَرْضَ، وَهَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن واللفظ لأبي داود.

**دەیەم:** هەرکاتێك بۆ بەرزایی سەرکەوت، بێ دەنگ هەڵێنان بڵێ: (اَللهُ أَكْبَرُ)، هەرکاتێك بۆ نەویایی هاتە خوارەوە، بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ) رواه البخاري. هەروەها لە هەر شوێنێك دابەزی -تاکو هیچ

شتێك زیانی لێنەدا- سوننەتە بڵێ: ﴿أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَاخَلَقَ﴾ رواه مسلم. جا هەر كاتێك ویستی لە شوێنەكە بڕوا، سوننەتە بە هەمان شێوەیڕابردوو، دوو ڕەكعەتیتر (سُنَّةالسَّفر) بكا.

**یازدەهەم:** هەر كاتێك چاوی كەوت: بە گوندێك=دێیەك، یان شارێك، یان هەوارگەیەك، سوننەتە بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَها وَخَيْرَ أَهْلِهَا وَخَيْرَ مَافِيها وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ أَهْلِهَا وَشَرِّ مَافِيهَا﴾حديث حسن رواه النسائي، خوایە لە تۆ دەپاڕێمەوە: بۆ چاكەی ئەو شوێنەو چاكەی خەڵكی ئەو شوێنەو چاكەی ئەو شتەی تیایەتی، خوایە خۆم دەپارێزم بە تۆ: لە خرابەی ئەو شوێنەو خرابەی خەڵكی ئەو شوێنەو خرابەی ئەو شتەی تیایەتی.

**دوازدەهەم:** لە هەر شوێنێك لە جنۆكەو شەیتان ترسا، سوننەتە: بانگ بدا، ئەگەر لە خاوەن دەسەڵاتێك، یان لە هەر كەسێكیتر ترسا، سوننەتە ئەم زیكرو دوعایانە بكا: ﴿لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَإِلَهَ إِلاَّأَنْتَ عَزَّ جَارُكَ وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ﴾ رواه ابن السنی. ﴿اَللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِى نُحُورِهِمْ وَنَعُوُذُبِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ﴾ رواه أبوداود بإسناد صحيح.

**سێزدەهەم:** سوننەتە-وەك لە ماڵەوەی-بەردەوام بێ لە سەر سوننەتەكانی(رَواتِب)ی پێش و دوای نوێژە واجبەكان، هەروەها ـ

تا تواناى هەيە، نوێژە سوننەتەکانىتريش بکا، چونکە پێغەمبەرﷺ لە سەفەريشدا بايەخى بە نوێژە سوننەتەکان دەدلو لە سەر پشتى ولاغيش دەيکردن ﴿عَن جابر وابن عُمرَ﴾: کانَ النَّبيُّﷺ يُصَلِّي عَلى راحلَته حَيْثُ تَوَجَّهَتْ به، فَإذا أَرادَالْفَريضَةَ نَزَلَ فاسْتَقْبَلَ الْقبْلَةَ-وَفىرِوايَة-: غَيْرَ أَنَّهُ لايُصَلِّي عَلَيْها الْمَكْتُوبَةَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە سەر پشتى وولاغ نوێژى سوننەتى دەکرد، جا وولاغەکەى بۆ هەر لايەك بڕۆشتبايە، بەلاّم بۆ نوێژىواجب دادەبەزىو ڕووى لە قيبلە دەکردو لە سەر پشتى وولاغ نوێژە واجبەکەى نەدەکرد.

**چواردەهەم**: هەر کاتێك کارو پێويستيەکانى پێك هاتن، سوننەتە: بە پەلە بگەڕێتەوە لاى ماڵو خێزانى خۆىو بەگوێرەىتواناش شتێك بە ديارى لەگەڵ خۆيا بێنێ بۆ منداڵەکانىو بۆ خزمو دۆستەکانى، هەروەك لە (إحياءالعلوم)و (الشرواني)دا فەرموويانە.

**پانزەهەم**: هەرکاتێك بۆ گەڕانەوەش وەڕێکەوت، سوننەتە هەمان دوعايەکەى ﴿اَللَّهُمَّ إنَّا نَسْأَلُكَ في سَفَرِنا هذا...﴾ىڕابردوو بکا، هەم بەردەوام بڵێ: ﴿ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ ﴾ رواه مسلم، ئينجا کە چاوى بە شوێنى نيشتەجێبوونى خۆى کەوت، سوننەتە هەمان دوعايەکەى ﴿اَللَّهُمَّ إنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَها...﴾ى ڕابردوو بکا، هەم ئەم دوعايەش: ﴿اَللَّهُمَّ اجْعَلْ لَنا بِها قَراراً وَرِزْقاً حَسَناً﴾حديث حسن رواه الطبراني، خوايە لەو شوێنەدا جێگيربوونو ڕزقێکى جوانم بدەيێ.

**شانزەهەم:** کە گەیشتەوەجێ-پێش ئەوەی بڕواتە ناو ماڵی خۆی- سوننەتە: بچێتە نزیکترین مزگەوت، دوو ڕەکعەت نوێژ لە ناو مزگەوتەکەدا بکا، بە ناوی سوننەتی گەڕانەوە ﴿عَنْ كَعْب -في قصَّةتَخلُّفه-: أَنَّ النَّبيَّ ﷺ كانَ إذا قَدمَ منْ سَفَرٍ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلسَ﴾رواه‌الشيخان، کە پێغەمبەر ﷺ لە سەفەر دەگەڕاوە، دەچووە ناو مزگەوتو دوو ڕەکعەت سوننەتی دەکردن پێش ئەوەی دابنیشێ.

**حەڤدەهەم:** سوننەتە زیافەتێك بکا-کە پێی دەگوترێ: (اَلنَّقيعَة)- بە بۆنەی گەڕانەوە ﴿عَنْ جابرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ الله ﷺ لَمَّا قَدمَ الْمَدينَةَ نَحَرَ جَزُوراً أَوْ بَقَرَةً﴾رواه البخاري، کە پێغەمبەر ﷺ لە سەفەر گەڕاوە (مدينة)، ووشترێك، یان ڕەشە وولاغێکی سەر بڕی.

**هەژدەهەم:** سوننەتە: باوەش لێوەرهێنانو ماچکردنی ئەو کەسەی لە سەفەر گەڕاوەتەوە ﴿قَدمَ زَيْدُ بن حَارثَةَ الْمَدينَةَ، فَأَتَى النَّبيَّ ﷺ فَقَرَعَ الْبَابَ فَقامَ إِلَيْه النَّبيُّ ﷺ فاعْتَنَقَهُ وَقَبَّلَهُ﴾رواه الترمذي بسند حسن، (زَيْد) لە سەفەر گەڕاوە (مدينة)و هاتە ماڵی پێغەمبەر ﷺ لە دەرگەیدا، پێغەمبەر ﷺ لەبەری هەڵساو باوەشی لێوەرهێناو ماچی کرد. ﴿وَتَلَقَّى رَسُولُ الله ﷺ جَعْفَرَ بن أَبيطَالب فَالْتَزَمَهُ وَقَبَّلَ مَا بَيْنَ عَيْنَيْه﴾ رواه أبوداود بسند صالح، پێغەمبەر ﷺ پێشوازی لە (جَعْفَر) کرد-کە لە سەفەری(حَبَشَة) گەڕاوە- باوەشی لێوەرهێناو نێوچاوانی ماچ کرد.

﴿ئاگاداری﴾: پێشوازیکردن له حاجی، له دوای(باسی زیارەتی گۆڕیپێغەمبەرﷺ) ڕوون دەکەینەوە، إن شاءالله تعالی.

* * *

## ﴿ باسی تەیەمموم ﴾

ئەگەر ڕێبوارەکە- بۆ دەستنوێژ، یان بۆ غوسلی جەنابەتو حەیز- ئاوی دەست نەکەوت، یان لەبەر سەرماو نەخۆشیو برینداری نەیتوانی ئاو بەکار بێنێ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا-بۆ دەسنوێژو بۆ غوسل- واجبە تەیەمموم بکا، جا بەو تەیەممومە نوێژەکانو واجبەکانیتر بکا، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغائِطِ أَوْ لامَسْتُمُ النِّساءَ فَلَمْ تَجِدُوا مآءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً﴾ ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون، یان لە سەفەردا بوون، بە هۆی پیسایی کردن، یان بە دەستلێدانی ئافرەتان بێدەستنوێژ بوون، جا ئاوتان دەست نەکەوت، بە گڵێکی پاك تەیەمموم بکەن.

واتە: بە تۆزی گڵێکیپاك ڕوخسارو هەردوو دەستەکان لەگەڵ ئەنیشکەکان مەسح بکەن، جیاوازی نیە تەیەممومەکە: بۆ بێدەستنوێژیی بچووك بێ، یان بۆ جەنابەتو حەیزو زەیسانیو منداڵبوون بێ، لە گشتیاندا تەنها ڕوخسارو هەردوو دەستەکان لەگەڵ ئەنیشەکەکان مەسح دەکرێن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە. جا حاڵەتەکانی تەیەممومیش بەگوێرەی ئەم ڕوونکردنەوەیەنە:

**یەکەم:** تا نوێژو واجبەکانی‌تر کاتی کردنیان نەیێ، دروست نیە تەیمموم بکا، ئینجا واجبە نیەتی تەیەمموم بێنی‌و بڵێ: (نَوَيْتُ إسْتِباحَةَالصَّلاةِ) نیەتمە نوێژ حەڵاڵ دەکەم. چونکە تەیەمموم دەستنوێژی ناچاری‌یەو هیچ بێدەستنوێژیەکی گەورەو بچووك لانابا، واتە: نوێژو تەوافو قورئانو ئەو شتانەی بە بێدەستنوێژی‌و جەنابەتو حەیز حەرامن، لە بەر ناچاری تەیەمموم حەڵاڵیان دەکا، جا هەر کاتێك نەخۆش چاك بۆوە، یان بێدەستنوێژو جەنابەتدارو زەیسانی‌و حەیزدار لە دوای تەیەممومکردن ئاویان دەست کەوت، واجبە: دەستنوێژ بگرن‌و غوسل بکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عن أبي ذرّ: أَنَّهُ كان تُصيبُهُ الْجَنابَةُ، فَقالَ النَّبيُّﷺ: اَلصَّعيدُ الطَّيِّبُ وَضُوءُ الْمُسْلِمِ وَإنْ لَمْ يَجد الْماءَ عَشْرَ سنِينَ فَإذا وَجَدَالْماءَ فَلْيُمسَّهُ بَشَرَتَهُ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، دەربارەی جەنابەتدار پێغەمبەرﷺ فەرمووی: گڵی پاك دەستنوێژگری موسڵمانە، هەر چەند تا دەساڵیش ئاوی دەست نەکەوێ، جا هەر کاتێك ئاوی دەست کەوت، با خۆی پێ پاك بکاتەوە لە بێدەستنوێژی‌ی گەورەو بچوك. واتە: چونکە تەیەمموم بێدەستنوێژی لانابا.

**دووەم:** هەر هۆیەك دەستنوێژ بشکێنێ، تەیەممومیش بەتاڵ دەکاتەوە، بە یەك تەیەمموم تەنها کردنی یەك واجب دروست دەبێ‌و زیاتر دروست نابێ ﴿عن ابن عمر رضي الله عنهما: يَتَيمَّمُ لِكُلِّ صَلاةٍ وَإنْ لَمْ يُحْدِثْ﴾ رواه البيهقي باسناد صحيح، بۆ گشت

نوێژێك واجبە تەیەمموم بکا هەرچەند بێدەستنوێژیش نەبوبێ. بەڵام تا حەز دەکا دروستە سوننەتەکان بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**سێیەم:** لە هەر شوێنێك –ڕێبوارەکە– لەبەر نەبوونی ئاو تەیەمموم بکا، بە زۆریش ڕوو بدا: لەو شوێنەدا ئاو نەبێ، ئەوە قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، بەڵام لە هەر شوێنێك کەم ڕوو بدا: ئاو نەبێو لەبەر نەبوونیئاو تەیەمموم بکا، واجبە: قەزا بکاتەوە، هەروەك لە سەر چاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

**چوارەم:** ئەگەر بە هۆی نەخۆشی، یان بریندار تەیەمموم بکا، واجب نیە نوێژەکان قەزا بکاتەوە، جیاوازی نیە نەخۆشیو برینەکە: هەموو لاشەی گرتبێتەوە، یان تەنها ئەندامێك، هەرچەند پێچەریش لە سەر ئەندامەکەی هەبێ، بەو مەرجەی پێچەرەکە لە سەر ئەندامی تەیەمموم نەبێو لە سەر بەدەستنوێژیو خاوێنی دانابێ.

**پێنجەم:** ئەگەر پێچەری برینو شکستەکەی لە سەر بێدەستنوێژی دانابێ، یان لە ئەندامی تەیەمومدا بێ، ئەوە –بۆ دەستنوێژو غوسل– واجبە: پێچەرەکە لاببا، جا ئەگەر نەگونجا لایببا، ئەو کاتە واجبە: تەیەمموم بکا، هەم لە دوای چاکبوونەوەش واجبە: نوێژەکان– بە دەستنوێژ– قەزا بکاتەوە، بەڵام بە فەرموودەیەکی بێهێز: قەزاکردنەوە واجب نیە، هەروەك لە زۆربەی سەر چاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

**شەشەم:** مرۆڤی بریندارو خاوەن شکست-پێش تەیەممومکردن- واجبە: ئەندامە ساغەکانی بە ئاو بشوا، ئینجا کە نۆبەتی شوێنە بریندارەکە هات، تەیەمموم دەکا، ئینجا ئەندامەکانی دوایتەیەمموم دەشوا؟ تاکو ڕیزی دەستنوێژ تێك نەچێ، جا ئەگەر ئەندامەکە پێچەری لە سەر بوو، واجبە: پێچەرەکەش بە ئاو مەسح بکا ﴿عن ابن عمررضی‌الله عنهما: أَنَّهُ تَوَضَّأَ وَكَفُّهُ مَعْصُوبَةٌ فَمَسَحَ عَلَيْها وَعَلىٰ الْعِصابَةِ وَغَسَلَ ماسِوىٰ ذٰلِكَ﴾ رواه البيهقي باسنادصحيح، حەزرەتی(عبداللهﷺ) دەستنوێژی گرتو لەپەدەستی پێچرا بوو، مەسحی لە سەر لەپەدەستو پێچەرەکە کردو ئەوەیتریشی شۆرد.

**حەفتەم:** ئەگەر-ڕێبوارەکە- بە هۆی سەرما تەیەمموم بکا، ئەوەش-بە فەرموودەی بەهێزتر- واجبە: نوێژەکان بە دەستنوێژ قەزا بکاتەوە، بەڵام بە فەرموودەیەکی بێهێز: قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**ئاگاداری:** لە باسی(حەج)، تەیەممومی تەوافیحەج ڕوون دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

*　　　*　　　*

## ﴿باسی (قَصْر)و(جَمْع): کورتکردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژەکان﴾

**یەکەم:** (قَصْر) کورتکردنەوەی نوێژ، (جَمْع) کۆکردنەوەی نوێژ، هەردووکی دروستن بۆ ڕێبوار، بەو مەرجەی سەفەرەکەی دوو

قۆناغ=(٨٠) هەشتا کیلۆمتر دوور بێ، واتە: ئەگەر لە هەشتا کیلۆمتر کەمتر بێ، (قَصْر)و(جَمْع) دروست نیە ﴿ عَنْ عَطَا: سُئِلَ ابن عَباس رضي الله عنهما: أأقْصُرُ الصَلاةَ إلى عَرَفَةَ؟ فقال: لاَ، وَلَكِنْ إلَى عُسْفَانَ وَإلَى جدَّةَ وَإلَى الطَّائف ﴾ رواه الشافعي والبيهقي باسناد صحيح، پرسیار لە (ابن عباس) کرا: ئایا کە لە (مکة) چوومە (عَرَفَة)، نوێژ کورت بکەمەوە؟ فەرمووی: نا، بەلاّم کە چوویە (عُسْفان)، یان (جدَّة)، یان (الطّائف) نوێژ کورت بکەوە. واتە: هەریەك لەو سێیانە، لای کەم هەشتا کیلۆمتر دوورن لە (مکة)ی پیرۆز.

**دووەم:** لەبارەی (قَصْر)، مەرجە: لەگەلّ (اَلله أكْبَر)ی نوێژدابەستندا نیەتی(قَصْر) بێنێ، جا بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام: تەنها نوێژە چوار ڕەکعەتیەکان کورت دەکرێنەوە بۆ دوو ڕەکعەت، نەك نوێژی سبەینێو مەغریب ﴿عَنْ عَائشَةَ رضي الله عنها: اَلصَّلاةُ أَوَّلَ مافرِضَتْ رَكْعَتان، فَأُقِرَّتْ صَلاَةُ السَّفَر وَأُتمَّتْ صَلاَةُ الْحَضَر﴾ رواه الشيخان، زاد أحمد وابن حبان وابن خزيمه: ﴿إلاّ الْمَغْرِبَ فَإنَّها وِتْرُ النَّهار، وَإلاّ الصُّبْحَ فَإنَّها تُطَوَّلُ فِيها الْقِرَاءَةُ﴾ یەکەمجار پێنج نوێژەکان دوو ڕەکعەت دوو ڕەکعەت واجب کران، ئینجا لە سەفەردا نوێژەکان وەك خۆیان بە دوو ڕەکعەتی مانەوەو لە ماڵەوەشدا تەولو کران، تەنها نوێژی مەغریب لە ماڵەوەو لە سەفەردا بە سێ ڕەکعەتی واجب کرا چونکە وەتری ڕۆژەیە، نوێژی سبەینێش هەر دوو ڕەکعەتە چونکە خوێندنی قورئانی تێدا درێژ دەکرێتەوە.

**سێیەم:** لەبارەی (جَمْع)، نیوەڕۆو عەسر لەگەڵ یەکتری، مەغریبو عیشا لەگەڵ یەکتری کۆ دەکرێنەوە ﴿عَنْ ابن عباس رضي الله عنهما: كانَ رَسُولَ الله ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ إذا كانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ وَيَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشاءِ﴾ رواه البخاری، پێغەمبەرﷺ لە سەفەردا نوێژی نیوەڕۆو عەسری بە یەکەوە کۆ دەکردنەوەو مەغریبو عیشاشی بە یەکەوە کۆ دەکردنەوە. ئینجا بزانە: هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە: نوێژی سبەینێ کۆ ناکرێتەوە: نە لەگەڵ عیشاو نە لەگەڵ نیوەڕۆ، هەروەها نوێژی عەسرو مەغریبیش لەگەڵ یەکتری کۆناکرێنەوە، هەروەك لە سەرچاوەکانیشدا فەرموویانە.

**چوارەم:** تا ڕێبوارەکە لە سنوری شوێنینیشتەجێبوونی نەڕواتە دەرەوە نابێتە ڕێبوار، واتە: نە (قَصْر)و نە (جَمْع)ی بۆ دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن أَنس رضي الله عنه: كَانَ رَسُول اللهﷺ إذا خَرَجَ ثَلاثَةَ أَمْيالٍ أَوْ فَرَاسِخَ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك پێغەمبەرﷺ سێ میل، یان سێ فەرسەخ دەچووە دەرەوە، نوێژی دەکردەوە دوو ڕەکعەت.

**پێنجەم:** هەرکاتێك ڕێبوارەکە گەیشتە شوێنی مەبەستیخۆی، ئەوە دەبێتە نیشتەجێ، واتە: هیچیتر (قَصْر)و (جَمْع)ی بۆ دروست نیە، هەروەها ئەگەر ڕێبوارەکە نیەتی وەهابێ: چوار ڕۆژان-بە شەوەکانیانەوە، یان زیاتر- لە شوێنێك بمێنێتەوە،

ئــەوەش هــەرکاتێك گەیشــتە ئــەو شــوێنە، دەبێتــە نیشــتەجێو هیچیتر (قَصر)و (جَمع)ی بۆ دروست نیـە، بـەڵام ئەگـەر لـە چوار ڕۆژان کـەمتر بـێ، ئـەو کاتــە (قَصــر)و (جَمـع)ی بـۆ دروسـتن، ڕۆژەکـەی هــاتنو ڕۆژەکـەی دەرچــوونیش لەگــەڵ ئــەو چــوارانە ناژمێردرێن، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿يُقِيمُ الْمُهَــاجِرُ بِمَكَّــةَ بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ ثَلاثًا﴾رواه الشیخان، سەحابە کۆچکەرەکان –لە دوای حەج کردن– تەنها سێ ڕۆژان لە (مكة)دا دەمێننـەوە. واتـە: پــێش (فَـتحِ مَكَّـة)، پێغەمبــەر ﷺ قەدەغــەی کردبــو ســەحابە کۆچکەرەکان لـە (مكـة)دا نیشتەجێ ببن –هـەروەك لـە (بخـاریو مسلم)دا هاتوە– بەڵام چونکە سێ ڕۆژ بە نیشتەجێیی دانانـدرێن، پێغەمبـەر ڕێگـەی داوە، کـەوابو: بـە مانـەوەی سـێ ڕۆژان بڕیـاری ڕێبواریی لە سەر لاناچێ، بەڵام بە چوار ڕۆژان لادەچـێ، هـەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: هەر بەبەلگـەی ئـەو حەدیسـە: ئەگـەر حـاجی بـە چـوار ڕۆژان پــێش وەســتانی (عَرفَــة)، گەیشــتە نــاو شــاری(مَكَّـة)، ئــەوە هیچیتر (قَصر)و(جَمع)ی بۆ دروست نیە: نە لە (مَكَّة)و نـە لـە(عَرفَـة)و نە لە(مُزدَلفَة)و نە لە(منى)؟ چونکە بوەتە نیشتەجێ، بەڵام ئەگـەر بـە دوو ڕۆژ، یان سـێ ڕۆژ پـێش وەسـتانی(عَرفَـة) گەیشتە (مَكَّـة)، ئـەوە (قَصـر)و(جَمـع)ی بـۆ دروسـتە: لــە (مَكَّـة)وە تــا لــە دوای ڕەجمــی هەرسێك شـەیتانەکان لـە (منـى) دەگەڕێتــەوە بـۆ (مَكَّـة)، ئینجـا –لـە دوای گەڕانەوەی لە (منى)– تەماشا دەکەین: ئەگـەر نیـەتی ئـەوەبێ:

چوار ڕۆژان، یان زیاتر لە (مَكّة)دا بمێنێتەوە، ئەوە هیچی‌تر (قَصْر)و(جَمْع)ی بۆ دروست نیە، بەلاّم ئەگەر نیەتی مانەوەی کەمتر لە چوار ڕۆژانی هەبو، ئەو کاتە (قَصْر)و(جَمْع)ی بۆ دروستە، هەروەك لە (تحفة)و(الشروانی) لە باسی(صَلاةُالمُسافِر)دا ڕوون کراوەتەوە، لە باسی وەستانی (عَرَفَة)ش دووبارە باسی(جَمْع) ڕوون دەکەینەوە، إنْ شاءالله تعالى.

**شەشەم:** ئەگەر ڕێبوارەکە لە شوێنێك مایەوەو چاوەڕوانی تەواوبوونی‌کارێکی دەکردو نەیدەزانی کەینێ کارەکەی تەواو دەبێ، نیەتیشی ئەوەبوو: هەرکاتێك کارەکەی تەواو بوو، لەو شوێنە بڕوا، ئەوە تا ماوەی(١٨)هەژدە ڕۆژان (قَصْر)و(جَمْع)ی بۆ دروستە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**حەفتەم:** ڕێبوار–ئەگەر مەرجەکانی تەواو بن–بۆی دروستە: (قَصْر)ش بکاو (جَمْع)ش بکا، هەم دروستە: تەنها یەکێکیان بکا، یان هیچیەکیان نەکا، جا لە حاڵەتی(جَمْع)دا دروستە: نوێژەکان بە جەماعەت لە پشت نیشتەجێ بکا، بەلاّم لە حاڵەتی(قَصْر)دا دروست نیە نوێژەکان بە جەماعەت لە پشت ئەو کەسە بکا: کە نوێژەکانی بە چوار ڕەکعەتی دەکا ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاس رضي الله عنهما أَنَّهُ سُئِلَ: مَا بَالُ الْمُسَافِرِ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ إِذَا انْفَرَدَ وَأَرْبَعاً إِذَاائْتَمَّ بِمُقِيمٍ؟ فَقَالَ: تِلْكَ السُّنَّةُ﴾رواه الإمام أحمد بإسناد صحيح، پرسیار لە (إبن عباس) کرا: بۆچی ئەگەر ڕێبوار نوێژ بە تەنهایی بکا دوو ڕەکعەت دەکا، ئەگەر بە جەماعەت لە پشت نیشتەجێ بیکا چوار ڕەکعەت دەکا؟ فەرمووی: ئەوە ڕێبازی پێغەمبەرە ﷺ.

**هەشتەم:** بۆ دروستبوونی (جَمْع التَّقْدِيم)–واتـە: پێشخسـتنی نوێـژی عەسر بۆ کاتی نیوەڕۆو پێشخستنی نوێژیعیشا بـۆ کاتیمـەغریب– مەرجە: پێشتر دەست بە نوێژەکەییەکەم بکاو نابـێ هـیچ نـاوبڕێکی درێژیش بکەوێتە نێوان نوێژەکەی یەکـەمو دووەم، هـەم مەرجـە: لـە نـاو نوێژەکەییەکەمـدا نیـەتی(جَمْـع التَّقْـدِيم)–واتـە: پێشخسـتنی نوێژی دووەم– بێنێ، ئەگینا: (جَمْع التَّقْدِيم)ی دروست نابـێ، بـەڵام بـە فــەرموودەی ئیمــامی(الْمُزَنــي) دروســتە: لــە کــاتی دابەســتنی نوێژەکـەی دووەمـدا نیـەتی(جَمْـع التَّقْـدِيم) بێنـێ، هــەروەك لــە (المجموع)دا گێڕاویەتیەوە، جا ئەگەر–لـە دوای تـەواوبوونی هـەردوو نوێژەکان– ڕێبوارەکە بووە نیشـتەجێو هێشـتاش کـاتی نوێژەکـەی یەکەم مابوو، یان تەنها کاتی نوێژەکەیدووەم مابوو، ئەوە لـە هـیچ حاڵەتێکدا دووبارەکردنـەوەی هیچیانی لـە سـەر نیـە، هـەروەك لـە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

**نۆیەم:** گوتمـان: لـە حاڵـەتی(جَمْـع التَّقْـدِيم)دا ئەگـەر ناوبڕێکیدرێـژ بکەوێتە نێـوان نوێـژەکان، (جَمْـع التَّقْـدِيم)ی دروسـت نابـێ، بەڵگـە: ﴿عَنْ جَابرٍ ﷺ فِي صِفَةِ وُقُوفِ النَّبِيِّ ﷺ بعَرَفَات: ثُمَّ أَذَّنَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَــيْئاً﴾ رواه مسلم، کە لە (عَرَفَة) بانگی نیـوەڕۆ دراو ئیقامـەت کـرا، پێغەمبـەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد، ئینجا دووبـارە ئیقامـەت کـراو نوێـژی عەسـری

به (جَمْع التَّقْدِيم) كردو هيچ سوننەتێكی لە نێوان هەردوو نوێژەكاندا نەكرد. كەوابو: سوننەتەكانی پێش نوێژیيەكەم دەكا، ئینجا كە هەردوو نوێژەكانی كردن، سوننەتەكانی دوای نوێژیيەكەمو سوننەتەكانی نوێژی دووەمیش دەكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا روون كراوەتەوە.

**دووەم:** بۆدروستبوونی(جَمْع التَّأْخِير)-واتە: دواخستنی نوێژی نیوەڕۆ بۆ كاتی عەسرو دواخستنی نوێژیمەغریب بۆ كاتیعیشا- مەرجە: لە كاتی نوێژەكەیيەكەمدا نیەتی(جَمْع التَّأْخِير)-واتە: دواخستنی نوێژەكە- بێنێ، هەم مەرجە: هەر لە سەفەردابێ تا هەردوو نوێژەكان تەواو دەبن، واتە: ئەگەر نیەتی(جَمْع التَّأْخِير)ی هێنا، ئینجا بووە نیشتەجێو هێشتاش كاتی نوێژەكەیيەكەم مابو، ئەو كاتە واجبە یەكسەر نوێژەكەیيەكەم-بە تەنها- لە كاتی خۆیدا بكا؟ چونكە لە سەفەردا نەماوە، هەروەها ئەگەر بۆ كاتی نوێژەكەیدووەم بووە نیشتەجێ، ئەوە دروست نیە: نوێژەكەی یەكەم بە(جَمْع التَّأْخِير) بكا، بەڵكو قەزای دەكاتەوەو گوناهباریش نابێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

﴿**پاشكۆ**﴾: هەر رێبوارێك لە سەفەری تاوانباریدابێ، واتە: سەفەرەكەی حەرام بێ، روخسەتەكانی سەفەری نادرێتێ، كەواتە: (قَصْر)و(جَمْع)ی نوێژەكانی بۆ دروست نیەو ئەگەر بە هۆی سەرماو نەخۆشی، یان لەبەر نەبوونی ئاو تەیەمموم بكا، واجبە: نوێژەكان -بە دەستنوێژ- قەزا بكاتەوە، وەك بە سەفەرچوون: بۆ

هِيَ سُنَّةٌ

---

مرۆڤکوشـــتن‌و ڕێگــــری‌و دزی‌و یارمه‌تیـــدانی ســـته‌مکاران‌و نیشـــته‌جێبوون لـــه نێـــوان کافرانـــدلو ســـه‌فه‌ری ژن بـــێ‌ئیزنی مێرده‌که‌ی‌و ئه‌و قه‌رزداره‌ی هه‌بووییه‌و کاتی قه‌رزدانه‌وه‌ی هـاتوه‌و بـــێ‌ئیزنی خـــاوه‌ن قه‌رزه‌کـــه‌ی بـــۆ ســـه‌فه‌ر ده‌ڕوا، یـــان هـــه‌ر گونـاهێکی‌تر، هـه‌روه‌ك لـه سه‌رچـاوه‌كاندا ڕوون کراوه‌تـه‌وه، بـه‌لام ئه‌گـه‌ر بێده‌سـه‌لاتێك بـه زۆرلێکـردن سـه‌فه‌رێکی حـه‌رامی پـێ‌کرا، ئـه‌وه بـه گوناهکـار دانانـدرێ‌و گشـت ڕوخسـه‌ته‌کانی سـه‌فه‌ری بـۆ دروستن، هه‌روه‌ك له(فتاوى ابن حجر)دا ڕوون کراوه‌ته‌وه.

* * *

ئیمامی(النَّواوي) له (مِنْهاج)دا ده‌فه‌رموێ:

﴿ كِتَابُ الأُضْحِيَّةِ: **په‌ڕتوکی قوربانی** ﴾

**قوربـــانی:** ئـــه‌و ئاژه‌ڵه‌یـه لـه جـه‌ژنی قوربانـدا سـه‌ر ده‌بـڕێ بـۆ خواپه‌رستی.

(هِـيَ سُـنَّةٌ) قوربـانی ســوننه‌تێکی (مُؤَكَّـدَة)یـه، خـوای گـه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾ نوێژی جه‌ژن بـۆ خـوای خـۆت بکه‌و قوربانی سـه‌ر ببڕه. ﴿وعن أنـــس ﷺ: ضَـــحَّى الـنَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ وَسَمَّى وَكَبَّرَ وَوَضَعَ رِجْلَـــهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا﴾ رواه الشيخان، پێغه‌مبـه‌ر ﷺ قوربـانی‌ی کرد بـه

دوو بـەرانی سـپیپاتی شـاخدار، بـە دەسـتی خـۆی سـەری بـڕین‌و گـوتی: (بسـم الله والله أكْبَـرُ)، پـێی خـۆی دانایـە سـەر تەنیشـتی ڕاستەی ئەستۆی بەرانەکان.

(لاَ تَجِبُ) قوربانی واجب نابێ (إلاّ بِالْتِزَامٍ) تـەنها ئەگـەر بـەخۆی لـە سەر خۆی واجب بکا، ئەو کاتە واجـب دەبـێ، هـەروەك لـە مـەودوا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

ئینجـا بزانـە: لـەبارەی خێزانێـك قوربـانی (سُـنَّةُ الْكِفَايَـة)یـە، واتـە: ئەگـەر ئەنـدامێکی بـالغ‌و عـاقڵی خێزانێـك قوربـانی بکـا، سـوننەتی قوربــانیکردن بــۆ گشــتیان دێتــە جــێ‌و خێرەکــەش بــۆ قوربانیکەرەکەیە، هـەروەك لـە سەرچاوەکاندا فەرموویانـە ﴿عـن أبي‌أيوب الانصاري: كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ﴾ رواه مالك والترمذي بسند صحيح، لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ پیـاو مـەڕێکی دەکـردە قوربـانی لـە بـری خـۆی‌و خێزانەکـەی، جـا بـەخۆیان لـە قوربانیەکـەیان دەخـواردو دەرخواردی خەڵکیشیان دەدا.

جـا بزانـە: خێـری قوربـانی لـە خێرکردنـی سـوننەت گـەورەترە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتـەتی: ﴿مَاعَمِلَ آدَمِيٌّ مِنْ عَمَلٍ يَوْمَ النَّحْرِ أَحَبَّ إِلَى‌اللهِ مِنْ إِهْرَاقِ الـدَّمِ...﴾الحديث، رواه الترمذي بسند حسـن، هــیچ ئادەمیزادێــك لــە ڕۆژی جــەژنی قوربانــدا هــیچ

وَيُسَنُّ لِمُرِيدِهَا أَنْ لاَ يُزِيلَ شَعَرَهُ وَلاَ ظُفْرَهُ فِي عَشْرِ ذِيالْحِجَّةِ حَتَّـــى يُضَحِّيَ، وَأَنْ يَذْبَحَهَا بِنَفْسِهِ، وَإِلاَّ فَلْيَشْهَدْهَا،

---

کردەوەیەکی وەها ناکا: کە لە خوێنڕشتنی قوربانی خۆشەویستتر بێ لە لای خوایگەورە. کەوابو: ئەگەر دەسەڵاتی هەبێ، ناپەسندە: قوربانی نەکا، چونکە ئیمامی(حنفی)و چەند زانایەکیتر بە واجبیان داناوە، هەروەها بۆ باوکو باپیرەش دروستە بە ماڵی خۆیان قوربانی بۆ منداڵە نەبالغەکانیان بکەن، بەڵام بە ماڵی منداڵەکان دروست نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُسَنُّ لِمُرِيدِهَا) بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ قوربانی بکا، سوننەتە –هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی–: (أَنْ لاَ يُزِيلَ شَعْرَهُ وَلاَ ظُفْرَهُ فِي عَشْرِ ذِيالْحِجَّةِ حَتَّى يُضَحِّيَ) کما رواه مسلم وأصحاب السنن، هیچ موویێکی لاشەیو هیچ نینۆکێکی لانەبا لە دە ڕۆژەکەی سەرەتای مانگی(ذيالْحِجَّة)دا، تا قوربانی دەکا.

جا بزانە: بەو دە ڕۆژانە دەگوترێ: (اَلأَيَّامُ الْمَعْلُومَات)، هەروەك لە(الإيضاح)دا فەرموویەتی.

(وَأَنْ يَذْبَحَهَا بِنَفْسِهِ) سوننەتە: بە دەستیخۆی قوربانیەکەی سەر ببڕێ ئەگەر بزانێو توانای هەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (أنس)یڕابردوو (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە دەستیخۆی سەری نەبڕێ، با وەکیلێك بگرێ بۆ سەر بڕینەکە، ئینجا (فَلْيَشْهَدْهَا) سوننەتە لە کاتی سەربڕینەکەدا لە لای قوربانیەکەی ئامادەبێ ﴿عن فاطمة رضیالله عنها:

أَنَّ النَّبيَّ ﷺ قال لَهَا: ﴿قُومِي إلى أُضْحِيَّتك فَاشْهَديهَا﴾ رواه البيهقي والحاكم وصححه، پێغەمبەرﷺ بە (فاطمة)ی فەرموو: هەڵسە برۆ لە لای قوربانیەکەت ئامادەبە.

کەواتە: بۆ ئافرەتانو بێهێزەکان وەها سوننەتە: وەکیلێك بگرن بۆ سەربڕینی قوربانیەکەیان، هەروەها بێهیچ هۆیەکیش دروستە وەکیل بگرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە لە (حَجَّةُ الوَداع)دا پێغەمبەرﷺ شەستو سێ ووشتری بە دەستیخۆی سەر بڕینو سیو حەفت ووشتریشی دانە دەست ئیمامی(علی) سەری برین، هەروەك لە (صحیح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

هەروەها پێش سەربڕین سوننەتە بڵێ: ﴿وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذي فَطَرَ السَّمَوات وَالأَرضَ حَنيفاً مُسْلماً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكينَ إنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّه رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبذَلكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلمِينَ﴾ رواه ابوداود بسند صالح، ئینجا بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ مِنْكَ وَلَك، بِسْمِ اللهِ وَاللهُ اَكْبَرُ، اَللَّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنِّي﴾ رواه الشيخان، ئینجا سەری ببڕێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ ئاژەڵی قوربانی ﴾

(وَلاَ تَصِحُّ) قوربانی دروست نابێ: (إلاَّ مِنْ إبِلٍ وَبَقَرٍ وَغَنَمٍ) تەنها لە ووشترو گاو مانگاو بزنو مەڕ دروست دەبێ، بە (إجماع)ی

وَشَرْطُ إبِلٍ أَنْ يَطْعَنَ فِي السَّنَةِالسَّادِسَةِ، وَبَقَرٍ وَمَعْزٍ فِيالثَّالِثَـةِ، وَضَـأْنٍ فِيالثَّانِيَةِ،

---

زانایان، چونکه پێغەمبەرو ﷺ (صحابة)کان هەر ئەو ئاژەڵانەیان کردونەتە قوربانی (وَشَـرْطُ إبِـلٍ أنْ يَطْعَـنَ فِيالسَّـنَةِ السَّادِسَـةِ) مەرجی دروستبوونی ووشتر ئەمەیە: پێنج ساڵی تەواو کردبێ‌و کەوتبێتە ساڵی شەشەم.
(وَبَقَرٍ وَمَعْزٍ فِيالثَّالِثَةِ) مەرجی دروستبوونی گاو مانگاو گامێش‌و بزن ئەمەیە: دوو ساڵیان تەواو کردبێ‌و کەوتبنە ساڵی‌سێیەم (وَضَأْنٍ فِيالثَّانِيَةِ) مەرجی دروستبوونی مەڕ ئەمەیە: ساڵێکی تەولو کردبێ‌و کەوتبێتە ساڵی‌دووەم، بەڵام ئەگەر مەڕەکە پێش تەولوکردنی ساڵێك ددانەکانی کەوتبێ، ئەو کاتە دروست دەبێ بکرێتە قوربانی، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:
﴿لاَ تَذْبَحُوا إلاَّ مُسِنَّةً إلاَّ أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ﴾ رواه مسلم، وزاد أحمد: ﴿فَإنَّهُ جَائِزٌ﴾، لە قوربانی‌دا جگە لە (مُسِنَّة) سەر مەبڕن، مەگەر دەستتان نەکەوێ، ئەو کاتە مەڕێکی ددان کەوتووی لە ساڵێك بچوکتر سەر ببڕن، چونکە قوربانی بە مەڕی ددان کەوتووش دروستە.
جا بزانە: (مُسِنَّة) بە ووشتری پێنج ساڵی‌و مانگاو بزنی دوو ساڵی‌و مەڕی یەك ساڵی دەگوترێ–بە (إجماع)ی زانایان–هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَيَجُوزُ ذَكَرٌ وَأُنْثَى وَخَصِيٌّ، وَالْبَعِيرُ وَالْبَقَرَةُ عَنْ سَبْعَةٍ، وَالشَّاةُ عَنْ وَاحِدٍ،

(وَيَجُوزُ ذَكَرٌ وَأُنْثَى) به (إجماع)ی زانایان: ئاژەڵی نێرو ئاژەڵی مێ دروسته بکرێته قوربانی، هەم (وَخَصِيٌّ) نێرینەی خەسێندراویش دروسته ﴿عن جابر‌ رضي الله عنه ضَحَّى النَّبِيُّ ﷺ بِكَبْشَيْنِ مَوْجُـــوأَيْنِ﴾ رواه أبوداود وغيره بسند صالح، پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی خەسێندراوی کردنه قوربانی.

(وَالْبَعِيرُ وَالْبَقَرَةُ عَنْ سَبْعَةٍ) تەنها ووشترێك، یان تەنها مانگایەك دروست دەبێ بۆ حەفت کەسان بکرێتە قوربانیو بکرێتە (فِدْيَة)ی حەجو عومرە، هەم دروستیشە لەو حەفت کەسانە هەندێکیان مەبەستیان تەنها گۆشت بێ، هەندێکیشیان مەبەستیان قوربانی، یان نەزر، یان (فِدْيَة)بێ، واته: له دوای سەربڕین گۆشتەکە بەش دەکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن جابر‌ رضي الله عنه: نَحَرْنَـــا مَـــعَ النَّبِيِّ ﷺ -بِالْحُدَيْبِيَةِ- الْبَدَنَةَ عَنْ سَبْعَةٍ وَالْبَقَـــرَةَ عَـــنْ سَـــبْعَةٍ﴾ رواه مسلم، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ووشترێکمان لەجیاتی حەفت کەسان سەر بڕیو مانگایەکیشمان لەجیاتی حەفت کەسان سەر بڕی.

(وَالشَّاةُ عَنْ وَاحِدٍ) مەڕێك، یان بزنێك تەنها بۆ یەك کەس دەبێتە قوربانی، واته: بزنێك، یان مەڕێك بە هاوبەشی بۆ دووکەسان نابێتە قوربانی، بەڵام دروستە قوربانیکەرەکە کەسێکیتر بکاتە هاوبەش لە خێری قوربانیەکەیدا، هەروەك لە (تحفه)و (مغنی)دا فەرموویانە.

وَأَفْضَلُهَا بعيرٌ ثُمَّ بَقَرَةٌ ثُمَّ ضَأْنٌ ثُمَّ مَعْزٌ، وَسَبْعُ شِيَاه أَفْضَلُ مِنْ بَعِيرٍ، وَشَاةٌ أَفْضَلُ مِنْ مُشَارَكَةٍ فِي بَعِيرٍ، وَشَرْطُهَا سَلاَمَةٌ مِنْ عَيْبٍ يَنْقُصُ لَحْمًا

---

(وَأَفْضَلُهَا بَعِيرٌ) لە هەموو قوربانییەکان خێرتر: ووشترێکە (ثُمَّ بَقَرَةٌ) ئینجا مانگایەك (ثُمَّ ضَأْنٌ ثُمَّ مَعْزٌ) ئینجا مەڕێك، ئینجا بزنێك، بەڵام (وَسَبْعُ شِيَاهٍ أَفْضَلُ مِنْ بَعِيرٍ) حەفت مەڕ خێرترن لە ووشترێك، یان مانگایەك، هەم (وَشَاةٌ أَفْضَلُ مِنْ مُشَارَكَةٍ فِي بَعِيرٍ) تەنها مەڕێك خێرترە لە هاوبەشیکردن لە ووشترێکدا، واتە: لە حەفتێکی ووشترێك.

## ﴿ عەیبەکانی قوربانی ﴾

(وَشَرْطُهَا) مەرجی دروستبوونی قوربانی، ئەمەیە: (سَلاَمَةٌ مِنْ عَيْبٍ يَنْقُصُ لَحْمًا) ئاژەڵەکە سەلامەت بێ: لە هەر عەیبێکی گۆشت کەم بکاتەوە، کەوابو: بە فەرموودەی بەهێزتر: ئاژەڵی ئاوس نابێتە قوربانی، بەڵام (إبن الرفعة)و (أبومخرمة) ئەو فەرموودەیان بە ڕاست داناوە: کە دروستە ئاژەڵی ئاوس بکرێتە قوربانی بەو مەرجەی ئاوسیەکەی کاری لە کەمکردنەوەی گۆشتەکەی نەکردبێ، هەروەك لە (فتح المعین)و (بغیةالمسترشدین)دا فەرموویانەو لە زۆربەی سەرچاوەکانیشدا ڕەد کراوەتەوە، کەوابو: ئەگەر ئاژەڵەکە بە هۆی ئاوسی لاواز نەبوبێ، دروستە: بە (تقلید)ی ئەو زانایانە بکرێتە قوربانی، هەروەها ئەو ئاژەڵەی تازە زاوە، ئەویش دروستە بکرێتە قوربانی، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا –بە پێچەوانەی (مغنی)– فەرموویانە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر نەزری کرد ئاژەڵێکی بێعەیبی دیارکراو بکاتە قوربانی: وەك ئەم مەڕە، ئینجا لە دوای نەزرەکە ئاژەڵەکە عەیبێکی لێپەیدا بوو، ئەوە دەبێ بیکاتە قوربانیو بۆیشی دەبێتە قوربانیو دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر نەزری کرد: ئاژەڵێکی عەیبدار بکاتە قوربانی، ئەوەش واجبە: لە کاتی قوربانیدا بیکاتە قوربانیو گۆشتەکەشی بەش بکا، بەڵام بۆی نابێتە قوربانیو دروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا، ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە، کەواتە: ئاژەڵەکە دەبێتە خێر، بەڵام لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر لە کاتی قوربانیدا عەیبەکەی نەمابێ، ئەوە دەبێتە قوربانیو دروست دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(فَلاَ تُجْزِئُ عَجْفَاءُ) ئەو ئاژەڵەی بە هۆی لەڕی مێشکی نەماوە، نابێتە قوربانی، هەم (وَمَجْنُونَةٌ) ئاژەڵی شێت=گێژ نابێتە قوربانی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَرْبَعٌ لاَ تَجُوزُ فِي الأَضَاحِي: اَلْعَوْرَاءُ الْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ الْبَيِّنُ ضَلْعُهَا، وَالْكَسِيرَةُ الَّتِي لاَتُنْقَى﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، چوار ئاژەڵ بۆ قوربانی دروست نابن: ئەوەی چاوێکی بە ئاشکرایی کوێرە، ئەوەی بە ئاشکرایی نەخۆشە، ئەوەی بە ئاشکرایی دەشەلێ، ئەوەی مێشکی نەماوە.

(وَمَقْطُوعَةُ بَعْضِ أُذُنٍ) ئەو ئاژەڵەی بەشێکی گوێی، یان بەشێکی زوبانی، یان بەشێکی دونگی، یان بەشێکی گوانی، یان بەشێکی

كلكی لێكرلوەتەوە، ئەویش دروست نیە بكرێتە قوربانی، هەر چەند لێكراوەكەش كەم بێ، هەروەها ئەو ئاژەڵەی لە زگماكدا گوێیەكی نیە، ئەویش نابێتە قوربانی، بەڵام ئەگەر گوێی زۆر بچوك بێ، یان لە زگماكدا: گوانی نەبن، یان دونگی نەبێ، یان كلكی نەبێ، ئەوە دەبێتە قوربانی، هەروەها لە فەرمودەی ئیمامی(حنفی)دا: ئەگەر لە سێیەكی گوێی كەمتری لێكرابێتەوە، دروست دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كرلونەوە.

(وَ) هەر بە بەڵگەی حەدیسەكەی ڕابردوو: (ذَاتُ عَرَجٍ) ئاژەڵی شەلەو (وَعَوَرٍ) ئاژەڵی یەك چاو نابنە قوربانی، هەر چەند لە كاتی سەربڕینیشدا شەلە ببێ، یان كوێر ببێ، بەڵام بە مەزهەبی ئیمام(أحمد): ئەگەر سپیایی لە سەر چاوی هەبێو چاوەكەی نەڕۆیشتبێ، دروستە بكرێتە قوربانی، هەروەك لە (مغنی ابن قدامة)دا فەرموویەتی.

هەم (وَمَرَضٍ) ئاژەڵی نەخۆش –كە بە هۆی نەخۆشی لاولز بوبێ– نابێتە قوربانی، هەم (وَجَرَبٍ) ئاژەڵێ بە خروشت نابێتە قوربانی (بَيِّنٍ) ئەگەر ئەو چولر عەیبانە ئاشكرا بن، بەڵام (وَلاَ يَضُرُّ يَسِيرُهَا) كەمێكی ئەو چولر عەیبانە –كە كار لە گۆشتەكەی نەكا– زیانی نیەو ئاژەڵەكە دەبێتە قوربانی، هەم (وَلاَ فَقْدُ قَرْنٍ) نەبوونی قۆچ=شاخ زیانی نیە، واتە: ئاژەڵی بێقۆچو قۆچ شكاو دەبێتە قوربانی، بەڵام ئەگەر شكانی قۆچەكەی كاری لە گۆشتەكە كردبێ، ئەو كاتە نابێتە قوربانی.

وَكَذَا شَقُّ أُذُن وَثَقْبُهَا فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ الْمَنْصُوصُ يَضُرُّ يسِيرُ الْجَرَب وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَدْخُلُ وَقْتُهَا إِذَا ارْتَفَعَت الشَّمْسُ كَرُمْحٍ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ مَضَى قَدْرُ رَكْعَتَيْنِ وَخُطْبَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ

---

(وَكَذَا شَقُّ أُذُنٍ وَثَقْبُهَا) هەروەها لەتكردنی گوێو داغكردنو كونكردنیشی زیانی نیە، بەو مەرجەی بە هۆی كونكردنەكە هیچی لێنەڕۆیشتبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) فەرموویەتی (اَلصَّحِيحُ الْمَنْصُوصُ: يَضُرُّ يَسِيرُ الْجَرَبِ) بە دەقی فەرموودەیڕاست: كەمێكی خروشت زیانی هەیەو ئاژەڵەكە نابێتە قوربانی (وَاللهُ أَعْلَمُ).

هەروەها ئەگەر گشت ددانەكانی نەمابن نابێتە قوربانی، بەڵام ئەگەر هەندێكیان نەمابنو نەمانەكەشیان كاری لە گۆشتەكەی نەكردبێ، ئەو كاتە زیانی نیەو دەبێتە قوربانی، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ كاتی سەربڕینی قوربانی ﴾

(وَيَدْخُلُ وَقْتُهَا) كاتی سەربڕینی قوربانی دادێ: (إِذَا ارْتَفَعَتِ الشَّمْسُ كَرُمْحٍ يَوْمَ النَّحْرِ) هەركاتێك لە ڕۆژیجەژنیقورباندا بە قەد ڕمێك ڕۆژ بەرز بۆوەو (ثُمَّ مَضَى قَدْرُ رَكْعَتَيْنِ وَخُطْبَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ) ئینجا ئەندازەی دوو ڕەكعەتو دوو ووتاری سوكیش بە سەردا ڕۆیشت، واتە: ئەگەر پێش هاتنی كاتەكە قوربانیی سەر بڕی، ئەوە دروست نابێو نابێتە قوربانی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا: أَنْ نُصَلِّيَ ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ،

وَيَبْقَى حَتَّى تَغْرُبَ آخِرَ التَّشْرِيقِ، قُلْتُ: ارْتِفَاعُ الشَّمْسِ فَضِيلَةٌ، وَالشَّرْطُ طُلُوعُهَا ثُمَّ مُضِيُّ قَدْرِ الرَّكْعَتَيْنِ وَالْخُطْبَتَيْنِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ هَذَا فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لِأَهْلِهِ لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ﴾ رواه الشيخان، يەکەم شت لە ڕۆژی جەژنی قورباندا نوێژی جەژن دەکەین، ئینجا دەگەڕێینەوە قوربانی سەر دەبڕین، جا هەر کەسێك ئەوها بکا، ئەوە ڕێبازی ئێمەی دەست کەوتوە، هەر کەسێکیش لە پێش ئەو کاتەدا قوربانی سەر ببڕێ، ئەوە گۆشتێکە داویەتیە خێزانو منداڵەکانیو هیچی نابێتە قوربانی.

(وَيَبْقَى حَتَّى تَغْرُبَ آخِرَ التَّشْرِيقِ) کاتی سەربڕینی قوربانی دەمێنێ تا ڕۆژ ئاوا دەبێ لە کۆتایی سێ ڕۆژەکەی (أَيَّامِ التَّشْرِيقِ)ی دوای جەژنیقوربان، واتە: ماوەی سەربڕینی قوربانی چوار ڕۆژان بەردەوام دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿أَيَّامُ مِنَى كُلُّهَا مَنْحَرٌ﴾ صححه ابن حبان، ڕۆژەکانی(مِنَى) گشتی کاتی سەربڕینی قوربانيیە. (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) فەرموویەتی (ارْتِفَاعُ الشَّمْسِ فَضِيلَةٌ) بەرزبوونی ڕۆژ بە قەد ڕمێك خێرەو مەرج نیە، چونکە (وَالشَّرْطُ) مەرجی دروستبوونی قوربانی: (طُلُوعُهَا) ڕۆژ هەڵاتنەو (ثُمَّ مُضِيُّ قَدْرِ الرَّكْعَتَيْنِ وَالْخُطْبَتَيْنِ) ئینجا ئەندازەی دوو ڕەکعەتەکەو دوو وتارەکەش بڕوا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

جا بزانە: لەو چوار ڕۆژانەدا–بۆ سەربڕینیقوربانی–جیاوازی شەو و ڕۆژ نیە، جا ئەگەر چوار ڕۆژەکان ڕۆیشتنو قوربانیەکەی سەر

نەبڕی، ئەوە لەم ساڵەدا قوربانیەکە قەزا ناکرێتەوە، کەواتە: ساڵێکیتر قوربانی دەکا، بەڵام ئەگەر نەزری کردبو ئاژەڵێکی دیارکرلو بکاتە قوربانی، ئینجا چوار ڕۆژەکانی جەژن بەسەر چونو قوربانیەکەی سەر نەبڕی، ئەوە لەم مەسەلەیەدا واجبە: هەر لەم ساڵەدا بە قەزاکردنەوە سەری ببڕێو گۆشتەکەشی بداتە هەژاران، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ نەزرکردنی قوربانی ﴾

(وَمَنْ نَذَرَ مُعَيَّنَةً) هەر کەسێك نەزری کرد: ئاژەڵێکی دیارکرلو بکاتە قوربانی (فَقَالَ: لِلّهِ عَلَيَّ أَنْ أُضَحِّيَ بِهَذِهِ) گوتی: لە سەرم بێ بۆ خوا ئەم مەڕە بکەمە قوربانی، یان نەزربێ ئەم بزنە بکەمە قوربانی، یان لە سەرم بێ ئەم مانگایە بکەمە قوربانی، یان ئەم بەرانەم کردە قوربانی. ئەوە لەو حاڵەتانەدا ئاژەڵەکە لە ملکایەتیی لادەچێو دروست نیە دەستکاریی بکا، کەوابو: (لَزِمَهُ ذَبْحُهَا فِي هَذَا الْوَقْتِ) لە سەری واجبە: هەر ئەم ساڵ لە ماوەی چوار ڕۆژەکەی جەژنی قورباندا– بە ئەداء– سەری ببڕێو دروست نیە: بۆ ساڵێکیتر دوای بخێ، واتە: ئەگەر چوار ڕۆژەکەی جەژنی ئەم ساڵ ڕۆیشتنو سەری نەبڕی، ئەو کاتەش واجبە: هەر لەم ساڵەدا–بە قەزا– سەری ببڕێو گۆشتەکەشی بداتە هەژاران–هەروەك تازە ڕابرا– جا ئەگەر نەزرکەرەکە مرد، ئەو کاتە میراتگرەکەی بۆی دەکا، هەروەك لە باسی(قوربانی بۆ مردوو) بەڵگەی بۆ دێنین،إن شاءالله تعالى.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر مەڕێکی کڕی‌و نیەتی قوربانی‌ی لێهێنا، ئەوە هەر ملکی خۆیەتی‌و واجب نیە سەری ببڕێ تا بە زوبان نەزری دەکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بەڵام زۆر کەس کە قوربانی دەکڕێ‌و لێی دەپرسن: ئەمە چی‌یە؟ وەڵام دەداتەوە: ئەمە قوربانی‌یە. جا بەگوێرەی (تحفة)و (نهاية) بەم ووشەیە ئاژەڵەکە دەبێتە قوربانی‌ی نەزرکراو، بەڵام ئیمامی (الأذرعي)و چەند زانایەکی‌تر فەرموویانە: ئەگەر مەبەستی خەبەردان بێ: کە ئەمە قوربانی‌ی سوننەتەو مەبەستی نەزرکردنی نەبێ، ئەوە لێی قبوڵ دەکرێ‌و قوربانیەکە بە سوننەت دادەندرێ‌و لە سەری واجب نابێ، هەروەك لە (بغية المسترشدين)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإنْ تَلفتْ قَبْلَهُ) جا ئەگەر نەزرکراوەکەی‌دیارکراو لە پێش هاتنی جەژنی‌قورباندا فەوتا، یان دزرا، یان گوم بوو، ئەوە (فَلاَ شَيْءَ عَلَيْه) نەزرکەرەکە هیچی لە سەر نیە، بەو مەرجەی کەمتەرخەمی‌ی نەکردبێ، کەواتە: ئەگەر پێش هاتنی جەژن ئاژەڵە نەزرکراوەکە هاتە سەر حاڵەتی فەوتان، ئەو کاتە واجبە: سەری ببڕێ‌و گۆشتەکەی بداتە هەژاران، ولتە: نابێتە زامین، بەڵام ئەگەر بۆی گونجاو بە قەسدی سەری نەبڕی، ئەو کاتە دەبێتە زامینی قوربانیەکە، هەروەك (الشبراملسي) فەرمویەتی.

بەڵام (وَإنْ أتْلَفَهَا) ئەگەر نەزرکەرەکە بەخۆی ئاژەڵە دیارکراوەکەی فەوتاند، یان کەمتەرخەمی کرد بۆیێ فەوتا، یان

گوم بوو، ئەو كاتە (لَزِمَهُ أَنْ يَشْتَرِيَ بِقِيمَتِهَا مِثْلَهَا) لە سەری واجبە: بە نرخی ئاژەڵە فەوتاوەكە ئاژەڵێكی وێنەیخۆی بكڕێو هەم (وَيَذْبَحَهَا فِيهِ) واجبە: لە جەژنی قوربانی ئەم ساڵدا سەری ببڕێو گۆشتەكەی بەش بكا.

هەروەها ئەگەر بێگانەیەكیش ئاژەڵەكەی فەوتاند، واجبە نرخەكەی لێبستێنێو ئاژەڵێكی وێنەی خۆی پێبكرێو لە جەژنی قوربانی ئەم ساڵدا سەری ببڕێ، هەروەها ئەگەر نەزركەرەكە، یان بێگانەیەك لە پێش جەژنی قورباندا ئاژەڵەكەی سەر بڕی، ئەو كاتە واجبە: گۆشتەكەی بدرێتە هەژارانو هەم بە نرخەكەشی ئاژەڵێكیتری وێنەیخۆی بكڕدرێو بكرێتە قوربانی، بەلام ئەگەر بێگانەكە لە چوار ڕۆژەكەی قوربانیدا سەری ببڕێ، ئەو كاتە دەبێتە قوربانیو خاوەنەكەش گۆشتەكەی بەش دەكا، بەلام ئەگەر بێگانەكە گۆشتەكەشی بەش كردبو، ئەو كاتە بە فەوتێندراو دادەندرێو نابێتە قوربانی، هەروەها ئەگەر لە دوای چوار ڕۆژەكەی جەژن ئاژەڵەكە بفەوتێ، یان بفەوتێندرێ، زامینیی هەر واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَإِنْ نَذَرَ فِي ذِمَّتِهِ) ئەگەر لە ئەستۆی خۆیدا نەزری كرد قوربانی بكا: وەك لە سەرم بێ قوربانی بكەم (ثُمَّ عَيَّنَ) ئینجا لە دوای نەزركردنەكە ئاژەڵێكی دیاری كرد: وەك ئەم بزنە بۆ قوربانیەكەی

نەزرکراوم بێ، ئەوەش (لَزِمَهُ ذَبْحُهُ فيه) لە سەری واجبە: ئاژەڵە دیارکراوەکە لە چوار ڕۆژەکەی جەژنی قوربانیدا سەر ببڕێ، بەڵام لەم مەسەلەیەدا (فَإِنْ تَلفَتْ قَبْلَهُ) ئەگەر دیارکراوەکە پێش هاتنی جەژن فەوتا، ئەوە (بَقِيَ الأَصْلُ عَلَيْه) بنچینەی نەزرەکەی هەر لە سەر دەمێنێ، واتە: واجبە: ئاژەڵێکیتر بکاتە قوربانی (في الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

هەروەها ئەگەر ئاژەڵێکی دیاری کرد بۆ نەزرەکەی، ئینجا ئاژەڵەکە عەیبێکی لێپەیدا بو، ئەو کاتەش دیارکردنەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، کەواتە: ئەم عەیبدارە دەبێتە ملکیخۆیو لە سەری واجبە: یەکێکیتری بێعەیب بکاتە قوربانی، بەڵام ئەگەر قوربانیە نەزرکراوەکەی سەر بڕیو گۆشتەکەی بەش نەکرد تا گۆشتەکەی بۆگەنو خراپ بوو، ئەو کاتە واجبە: بە ئەندازەی گۆشتەکە گۆشتێکیتر بکڕێو بیدلتە هەژاران، واتە: واجب نیە: ئاژەڵێکیتر سەر ببڕێ، هەروەك لە (مغني)و (الشرواني)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿ باسی نیەتی قوربانی ﴾

(وَتُشْتَرَطُ النِّيَّةُ) بە مەرج دادەندرێ نیەتی قوربانی بێنێ: وەك نیەتمە ئەم ئاژەڵەم کردە قوربانی. واتە: بێنیەتهێنان قوربانی دروست نابێ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بالنِّيَّاتِ﴾ رواه الشيخان، هەر کردەوەیەکی خواپەرستی بێ بە نیەت نەبێ دانامەزرێ.

عِنْدَ الذَّبْحِ إنْ لَمْ يَسْبِقْ تَعْيِينٌ، وَكَذَا إنْ قَالَ: جَعَلْتُهَا أُضْحِيَّةً فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ وَكَّلَ بِالذَّبْحِ نَوَى عِنْدَ إعْطَاءِ الْوَكِيلِ أَوْ ذَبْحِه،

---

ئینجا نیەتهێنانەکەش (عِنْدَالذَّبْحِ) لە کاتی سەربڕینی قوربانیەکەیدا بێ (إنْ لَمْ يَسْبِقْ تَعْيِينٌ) ئەگەر پێشدا دیاری نەکردبێ، واتە: ئەگەر ئاژەڵێکی جیاکردەوە بۆ قوربانیی سوننەت، یان لە جیاتی قوربانیی نەزرکراو ئاژەڵێکی دیاری کرد، ئەو کاتە دروستە لە کاتی جیاکردنەوەو دیاریکردنەکەدا نیەت بێنێ، هەم دروستە لە پێش سەربڕینی قوربانیدا نیەت بێنێ، بەڵام دروست نیە لە دوای سەربڕینەکە نیەتی قوربانی بێنێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَكَذَا إنْ قَالَ: جَعَلْتُهَا أُضْحِيَّةً) هەروەها ئەگەر گوتی: ئەم مەڕەم کردە قوربانی. ئەو کاتەش مەرجە: لە کاتی سەربڕیندا، یان پێش سەربڕین نیەتی قوربانی بێنێ، واتە: دیاریکردنەکە بە بەر نیەتەکە ناکەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام لەلای (إمام الحرمین)و (الامام الغزالی): لەم مەسەلەیەشدا دیاریکردنەکە بەسەو بە بەر نیەتەکە دەکەوێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَإِنْ وَكَّلَ بِالذَّبْحِ) ئەگەر کەسێکی کردە وەکیلیخۆی بۆ سەربڕینەکە، ئەوە (نَوَى عِنْدَ إعْطَاءِ الْوَكِيلِ) لەو کاتەی ئاژەڵەکە دەداتە دەست وەکیلەکە، نیەتەکە دێنێ (أَوْ ذَبْحِه) یان لەو کاتەی وەکیلەکە قوربانیەکە سەر دەبڕێ، ئەویش نیەتەکە دێنێ، هەم دروستە موسوڵمانێکی فامیدە بکاتە وەکیل بۆ جیاکردنەوەی

قوربانیو بۆ نیەتهێنان لە کاتی جیاکردنەوە، یان لە کاتی سەربڕینەکە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ خواردنی گۆشتی قوربانی ﴾

(وَلَهُ) بۆ قوربانیکەرەکە دروستە: (اَلأَكْلُ مِنْ أُضْحِيَّةٍ تَطَوُّعٍ) لە گۆشتی قوربانیە سوننەتەکەی بخوا، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿كُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا﴾ رواه الشيخان، گۆشتی قوربانیەکەتان بخۆنو بشیدەنە موسوڵمانانو پاشەکەوتیشی بکەن.

(وَإِطْعَامُ الأَغْنِيَاءِ) هەم دروستە: گۆشتی قوربانیی سوننەت -بە تازیو بە کوڵاویی- دەرخواردی دەوڵەمەندان بدا (لاَ تَمْلِيكُهُمْ) بەڵام دروست نیە گۆشتەکە بە ملکایەتی بداتە دەوڵەمەندەکان، بەڵکو بە دیاری بۆیان دەنێرێ، کەواتە: بۆ دەوڵەمەندەکان دروست نیە: گۆشتەکەی قوربانی بفرۆشن، یان بیبەخشن، بەڵکو دەبی بیخۆن، یان بیکەنە خێرو میوانداری، بەڵام بۆ هەژاران دروستە: گۆشتی قوربانی بفرۆشن.

﴿ئاگاداری﴾: ئەوکەسەی بە وەکیلایەتی قوربانی بۆ کەسێکی‌تری زیندوو، یان مردوو دەکا، دروست نیە: نە بەخۆیو نە ژنو منداڵەکانیشی لە قوربانیەکە بخۆن، هەم -ئەگەر قوربانیەکەی کەسەکە نەزرکراو بێ- دروست نیە: بیداتە دەوڵەمەندەکانیش، هەروەها ئەگەر قوربانیەکەی‌خۆیشی واجب-نەزرکراو بێ، دروست نیە: بەخۆیو ژنو منداڵەکانی لە گۆشتەکەی بخولو هەم دروستیش

